# مستەر بین لە شاردا

# MR BEAN

## IN TOWN



وەرگێڕانی
ڕەشوان ڕەمەزان گەلالی

التفسير للنشر والإعلان
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

# مستەر بین لە شاردا

وەرگێڕانی

ڕەشوان ڕەحمان گەلاڵی

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: مستەر بین لە شار دا
وەرگێرانی: رەشوان رەمەزان گەلالی
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خــە ت: نەوزاد کۆیی
بەرگ : أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٨ك - ٢٠٠٧ز
تـــــــیراژ: ٣٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٨١٥) ی ساڵی

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# Introduction

*The meat was in* Mr *Bean's mouth, but he didn't want to* eat *it. He wanted to put it somewhere. But where? He looked at the man with the violin. He moved quickly. He pulled open the back of the man's trousers and opened his mouth. The meatfell inside the trousers!*

What happens when Mr Bean goes to a restaurant for his birthday dinner? He doesn't understand everything on the menu, and he doesn't like his food. He doesn't want to eat it, but what can he do? He tries to hide the food - in strange places!
'The next day, he takes his clothes to the launderette. Oh dear, life is often very difficult for Mr Bean! What happens in the launderette? He loses his trousers, of course!

The writers of these two very funny stories about the famous Mr Bean are Rowan Atkinson, Richard Curtis, Robin Driscoll and Andrew Clifford. Rowan Atkinson *is* Mr Bean. You often see him on television and on video. You can also see him at the cinema, in the film *Bean*. This is the second Penguin Reader about Mr Bean.

# پێشەكی

گۆشتەكە لە ناو دەمی مستەر بین بوو. بەلاّم ئەو نەیدەویست بیخوات. دەیویست لە شوێنێك دایبنێت. بەلاّم لە كوێ؟ مستەر بین سەیری پیاوەكەی كرد كە كەمانجەی پێبوو. بەخێرایی جولاّیەوە و پشتەوەی پانتۆڵی كابرای كردەوە و دەمی خۆشی كردەوە. گۆشتەكە كەوتە ناو پانتۆڵی كابراكە!

ئاخۆ چی ڕوودەدات كاتێك كە مستەر بین بە مەبەستی یادكردنەوەی ڕۆژی لە دایك بوونی خۆی ئێوارەیەك بچێتە چێشتخانە؟ ئەو شارەزایی لە هەموو خواردنەكانی ناو لیستەكە نییە و حەزیش بە خواردنەكەی ناكات. ئەو نایەوێ خواردنەكە بخوات، بەلاّم ئاخۆ چی دەتوانێ بكات؟ مستەر بین هەوڵدەدا خواردنەكە لە شوێنی سەیردا بشارێتەوە.

ڕۆژی پاشتر، مستەر بین جل و بەرگەكانی خۆی دەباتە دوكانی جل شۆر. ئای، ئازیز! زۆر جار ژیان بۆ مستەر بین زۆر دژوار دەبێ!

ئاخۆ لە دوكانی جل شۆرەكە چی ڕوودەدات؟

بێ گومان، پانتۆڵەكەی خۆی وون دەكات!

نووسەرەكانی ئەم دوو چیرۆكە پێكەنیناویانەی كە دەربارەی مستەر بینی بەناوبانگن بریتین لە: ڕۆوان ئاتكینسۆن و ریچارد كیورتس و ڕۆبن دریسكۆڵ و ئاندروو كلیفۆرد. ڕۆوان ئاتكینسۆن ڕۆڵی مستەر بین دەبینێ. كە هەموو جار لە تەلەفزیۆن و ڤیدیۆكاندا دەیبینن. هەروەها لە سینەماش دەتوانن لەو فیلمە ببینن كە بە ناوی (مستەر بین)ە. ئەمە دووەم كتێبە لە زنجیرە كتێبی (پێنگوین) دەربارەی مستەر بین.

# Steak Tartare

It was Mr. Bean's birthday, and he wanted to enjoy it! What could he do?

'How can I make this important day a *happy* day?' he thought. 'I know. I'll go out to a restaurant for dinner this evening! I am sure that it will be nice!.'

Mr. Bean didn't often eat in restaurants, because they were sometimes very expensive. And he sometimes did things wrong when he was in a new or strange place.

Oh dear! Life wasn't easy for Mr. Bean!

That evening, Mr. Bean put on a clean shirt. He put on his best coat and trousers. He put on his best shoes. Then he drove to a restaurant in the centre of town.

He arrived at eight o'clock and went inside. It was a very attractive restaurant. Everybody was wearing their best clothes and there were flowers on every table.   .

'I'm going to like it here,' thought Mr. Bean."This is a good restaurant for my birthday"

The manager met him at the door. 'Good evening, sir,' he said. 'How are you? Would you like a table for one?'

'Yes, please,' said Mr. Bean.

'Follow me, sir,' said the manager.

He walked across the room to a table, and Mr. Bean went after him.

'Here you are, sir,' said the manager. 'This is a nice table.'

He pulled the chair away from the table. Then he waited for Mr. Bean to sit down. Mr. Bean looked at him.

# ستەیك تاتەر

ئەو رۆژە یادی رۆژی لە دایك بوونی مستەر بین بوو، ئەویش دەیویست خۆش رابـبوێرێ! ئاخۆ چی دەتوانێ بکات؟

مستەر بین بیری کردەوە:"ئاخۆ چۆن دەتوانم ئەم رۆژە گرنگە بکەمە رۆژێکی خۆش؟ دەزانم . ئەم ئێوارەیە دەچمە چێشتخانەیەك بۆ نانخواردنی ئێوارە. دڵنیام کە خۆش دەبێ!"

مستەر بین بەزۆری نانی لە چێشتخانەکان نە دەخوارد. چونکە هەندێ جار خواردنەکان زۆر گرانبەهابوون. ئەویش هەندێ جار کاری هەڵەی دەکرد، هەرکاتێ کە لە شوێنێکی نوێ یاخود نامۆ بووایە.

ئای ، خوایە! ژیان بۆ مستەر بین ئاسان نەبوو!

ئەو ئێوارەیە, مستەر بین قەمیسێکی خاوێن و باشترین چاکەت و پانتۆڵی خۆی لە بەرکرد و باشترین پێڵاوەکانی خۆیشی لە پێ کرد. پاشان بە ئۆتۆمبێل بەرەو چێشتخانەیەکی ناو جەرگەی شار کەوتە رێ.

مستەر بین کاتژمێر هەشت گەیشتە جێ و چووە ژوورەوە. چێشتخانەیەکی زۆر سەرنج راکێش بوو. هەموو خەڵکی باشترین جل و بەرگی خۆیان لە بەر کردبوو، هەروەها لەسەر هەموو مێزەکانیش گوڵ دانرابوو.

مستەر بین بیری کردەوە:"من ئێرەم زۆر لا خۆش دەبێ، ئەمە باشترین چێشتخانەیە بۆ یادکردنەوەی رۆژی لە دایك بوونم"

بەڕێوەبەری چێشتخانەکە لە پێش دەرگاکە پێشوازی لە مستەر بین کرد و گوتی:" گەورەم ئێوارە باش... چۆنی؟ ئایا مێزێکت بە تەنیا دەوێ؟"

مستەر بین گوتی:"بەڵێ، تکادەکەم"

بەڕێوەبەرەکە گوتی:"  گەورەم بەدوامدا وەرە "

بەڕێوەبەرەکە بەناو هۆڵەکەدا بەرەو مێزێك رۆیشت و مستەر (بین)یش بەدوایدا چوو.

بەڕێوەبەرەکە گوتی:" گەورەم فەرموو . ئەمە مێزێکی باشە"

بەڕێوەبەرەکە کورسیەکەی لە مێزەکە دوور کردەوە. پاشان چاوەڕوانی مستەر بینی کرد تا دابنیشێ.

مستەر بین سەیرێکی پیاوەکەی کرد.

---

ستەیك تاتەر: خواردنێکە پێك دێت لە گۆشت کە بە تەواوی نەکوڵاوە.

'Why is he taking my chair away?' thought Mr. Bean. 'What's he doing?' And he pulled the chair away from the manager and sat down quickly.

When the manager went away, Mr. Bean sat quietly for a minute. Then he remembered something. He took a birthday card and an envelope out of his jacket. Next, he took out a pen and wrote 'Happy Birthday, Bean' inside the card. Then he put the card into the envelope and wrote his name on the outside of it. He put it on the table, and put his pen back into his jacket.

After a minute or two, Mr. Bean pretended to see the card for the first time. 'Oh! This is a card - for me?' he said.

He opened the envelope and took out the card. He read it carefully. 'Now that's nice!' he said. 'Somebody remembered my birthday!'



*"Somebody remembered my birthday!"*

مستەر بین بیری کردەوە: "ئایا بۆچی ئەم پیاوە کورسیەکەی من لا دەبا، ئاخۆ خەریکی چییە؟"
پاشان مستەر بین کورسییەکەی لە بەرێوەبەرەکە سەندەوە و بەخێرایی دانیشت.
کاتێك کە بەرێوەبەرەکە ڕۆیشت، مستەر بین بۆماوەی خولەکێك بەبێدەنگی دانیشت. پاشان شتێکی بیر کەوتەوە. کارتێکی پیرۆزبایی ڕۆژی لەدایك بوون و زەرفێکی لەناو چاکەتەکەی خۆی دەرهێنا .
پاشان قەڵەمێکی دەرهێنا و لەناو کارتەکە نووسی " بین . یادی ڕۆژی لە دایك بوونت پیرۆز" پاشان کارتەکەی خستە ناو زەرفەکە و ناوی خۆشی لەسەر زەرفەکە نووسی. مستەر بین زەرفەکەی لەسەر مێزەکە دانا و قەڵەمەکەشی لە ناو چاکەتەکەی خۆی دانایەوە.
دوای یەك دوو خولەك، مستەر بین وای نیشاندا کە یەکەمجارە کارتەکە دەبینێ گوتی: "ئۆی، ئەمە کارتە بۆ من؟"
مستەر بین زەرفەکەی کردەوە و کارتەکەی دەرهێنا و بە ووردی خوێندییەوە، گوتی: "ئێستا ئەمە دڵخۆشکەرە!، یەکێك یادی ڕۆژی لە دایك بوونی منی بیرکەوتۆتەوە!"



"یەکێك یادی ڕۆژی لە دایك بوونی منی بیرکەوتۆتەوە!"

Then he put the card on his table. The manager arrived with the menu and gave it to Mr. Bean. Mr. Bean started to read it.

'Oh, dear!' he thought. 'Everything's very expensive! What can I have?'

Mr. Bean got out all of his money. He had a ten-pound note and some coins. He put the money on to a plate.

'How much have I got?' he said, and he moved the money round on the plate. 'Ten, eleven... And forty, fifty, fifty-five! Eleven pounds and fifty-five pence.' He looked at the menu again. What could he eat for eleven pounds fifty-five?

The manager came to his table. 'Are you ready, sir?' he asked.

'Yes ' said Mr. Bean. He put his finger on the menu. 'I'll have that, please.'

The manager looked at the menu. 'The steak tartare, sir. Yes, of course.' 'Yes,' said Mr. Bean. 'Steak.'

The manager took the menu and went away. Mr. Bean sat and looked round the restaurant. There were a lot of people in the room. There was a man and a woman at the next table. They ate and talked.

Suddenly, a waiter arrived at Mr. Bean's table with a bottle of wine.

'Would you like to try the wine, sir?' he said.

'Oh, yes please,' said Mr. Bean.

The waiter put some wine in Mr. Bean's glass and Mr. Bean had a drink. It was very nice! He smiled, and the waiter tried to put more wine into the glass.

Of course, the waiter was right. First, the customer tries his wine. When he is happy with it, the waiter gives him more wine. But Mr. Bean didn't know this, and he quickly put his hand across the glass.

پاشان کارتەکەی لەسەر مێزەکە دانا. بەڕێوبەرەکە بەخۆ بە لیستەکەوە هات و لیستەکەی دایە مستەر بین. مستەر (بین)یش دەستی بە خوێندنەوەی کرد. بیری کردەوە :"ئای خوایە هەموو خواردنەکان زۆر گران بەهان... ئاخۆ چی دەتوانم بخۆم؟"

مستەر بین پارەکەی خۆی هەموو دەرهێنا. وەرەقەیەکی (١٠) دە پاوەندی و هەندێ پارەی ئاسنیشی پێ بوو. پاشان پارەکەی لەسەر مێزەکە دانا. مستەر بین گوتی:" چەندم پارە پێ یە؟ " پارەکەی لەسەر قاپەکە بلاّو کردەوە " دە.. یانزە.. چل.. پەنجا.. پەنجا و پێنج؟ یانزە پاوەندو پەنجاو پێنج پێنس" دووبارە سەیری لیستەکەی کرد. ئاخۆ بە یانزە پاوەند و.پەنجا و پێنج پێنس چی دەتوانێ بخوا؟

بەڕێوبەرەکە هاتە لای مێزەکەی مستەربین و پرسیاری کرد:" گەوورەم ئامادەی ؟"

مستەر بین گوتی " بەڵێ " پەنجەی لەسەر لیستەکە دانا و گوتی " تکایە، ئەم خواردنە دەخۆم "

بەڕێوبەرەکە سەیری لیستەکەی کرد و گوتی: " گەورەم ستەیك تاتەر؟ بەڵێ بێ گومان "

مستەربینیش گوتی: " بەڵێ – ستەیك "

بەڕێوبەرەکە لیستەکەی برد و ڕۆیشت. مستەربین دانیشتبوو سەیری چێشتخانەکەی دەکرد . خەڵکێکی زۆر لە ناو هۆڵەکە هەبوون. لە مێزەکەی تەنیشتیەوە ژنێك و پیاوێك دانیشتبوون. چێشتیان دەخوارد و قسەیان دەکرد.

لەناکاو شاگردێك هاتە لای مێزەکەی مستەر بین و بتڵێك شەرابی لا بوو گوتی: " گەورەم حەز دەکەی شەرابەکە تاقی بکەیتەوە ؟" مستەربین گوتی " ئۆی، بەڵێ ، تکا دەکەم "

شاگردەکە هەندێ شەرابی لە گلاسەکەی مستەر بین کرد و ئەویش خواردیەوە . شەرابەکە زۆر بەتام بوو. مستەربین زەردەخەنەیەکی هاتە سەرلێو و شاگردەکە خەریك بوو هەندێ شەرابی زیاتر لە گلاسەکەی بکات .

بێ گومان ، شاگردەکە کارەکەی دروست بوو. یەکەم جار مەعمیلەکە شەرابەکە تاقی دەکاتەوە . کاتێك کە حەزی لێکرد، شاگردەکە شەرابی زیاتری پێ دەدات. بەڵام مستەربین ئەمەی نەدەزانی بۆیە بە خێرایی دەستی لەسەر گلاسەکە دانا .

---

پاوەند : دراوی بەریتانیە . (١٠٠) پێنس دەکاتە (١) پاوەند.



*'Would you like to try the wine, sir?'*

'No, thank you,' he said. 'I don't drink wine when I'm driving.' The waiter looked at him strangely - and walked away. He *didn't* say, 'Why did you try the wine when you didn't want it, you stupid man!'

Mr. Bean took the knife from the table and started to play with it. He pretended to be a bad man. He pretended to push the knife into somebody. But he didn't *really* want to kill anybody, of course. It was a game.

The woman at the next table looked at him angrily, and Mr Bean quickly moved the knife. Next, he hit the glasses and plate on his table with it. It sounded *Ping, ping, ping*! And after a minute, he played the song 'Happy Birthday' on the glasses. He smiled and thought, 'I'm very clever!' But the woman at the next table didn't think, 'That's clever!'



" گەورەم حەز دەكەی شەرابەكە تاقی بكەیتەوە؟"

مستەربین گوتی " نا سوپاس من كاتێ كە سەیارە لێبخورم شەراب ناخۆمەوە." شاگردەكە بە نامۆیی سەیری كرد و لێی دووركەوتەوە. شاگردەكە ئەی گوت :"ئەی بۆچی شەرابەكەت تاقی كردەوە كاتێك كە تۆ ئەت دەویست ، هەی گەوجە پیاو ؟"

مستەربین چەقۆیەكی سەر مێزەكەی هەلگرت و یاری پێ دە كرد . ئەو وای نیشان دەدا كە پیاوێكی خراپە . وای دەرخست كە بە چەقۆكە لە یەكێك دەدات. بەلأم لە راستیدا مستەر بین بەهیچ شێوە یەك ئەی دەویست كەس بكوژێت. ئەمە تەنها یاریەك بوو.

ئەو ئافرەتەی كە لە مێزەكەی نزیكیەوە دانیشتبوو بەتورەیی سەیری كرد و مستەربینیش چەقۆكەی لابرد. پاشان بە چەقۆكە لە گلاس و قاپەكانی سەر مێزەكەی خۆی دەدا. پینگ.. پینگ.. پینگ.. دەنگی دەدایەوە . دوای خولەكێك ، ئاوازی گۆرانی ( رۆژی لە دایك بوونت پیرۆز)ی بە گلاسەكان لێ دەدا. زەردەخەنەیەكی كرد و بیری كردەوە: " من زۆر زیرەكم " بەلأم ئافرەتەكەی كە لە مێزەكەی نزیكیەوە بوو وابیری نە دەكردەوە كە " ئەمە زیرەكی یە؟ "

or 'Oh yes, that's funny!' She thought, 'That man's really stupid!' And she looked hard at Mr. Bean.

Mr. Bean put the knife down and looked at his napkin. 'It's a very nice napkin,' he thought.
The waiter saw Mr. Bean looking at his napkin. He didn't say anything, but suddenly -*flick!* - he opened it for Mr. Bean. 'That's clever,' thought Mr. Bean. 'I'll try that!'

And he began to move his napkin. *Flick! Flick! Flick!*

Suddenly, the napkin flew out of his hand. It flew across on to the next table. The woman at the table looked round again. But Mr. Bean pretended not to see her. His face said, 'It's not *my* napkin!'
A minute later, the waiter arrived with his food. There was a large cover on the plate and Mr. Bean couldn't see the food. But he gave the waiter the money on the table.



*He began to move his napkin.*

یاخود "نۆی، بەڵێ ئەمە پێکەنیناوی یە" بەڵکو بیری کردەوە: "بەڕاستی ئەم پیاوە گەوجە" هەروەها بە دەم و چاوێکی گرژ سەیری مستەربینی کرد.

مستەربین چەقۆکەی داناو سەیری بەروانکەکەی کرد و بیری کردەوە " بەروانکەیەکی زۆر جوانە " شاگردەکە بینی کەوا مستەربین سەیری بەروانکەکە دەکات . شاگردەکە هیچی نە گوت ،

بەلام لەناکاو فلیك! – بەروانکەکەی بۆ مستەربین کردەوە. مستەربین بیری کردەوە " ئەمە کارێکی زیرەکانەیە ، منیش ئەمە تاقی دەکەمەوە ؟ " پاشان مستەربین دەستی کرد بە جولاندنی بەروانکەکە . فلیك ! فلیك ! فلیك!

لەناکاو بەروانەکە لە دەستی دەرچوو و کەوتە سەر مێزەکەی تەنیشتی . ئافرەتەکەی سەر مێزەکە دووبارە سەیرێکی دەورو بەری خۆی کرد. بەلام مستەربین وای دەرخست کە ئەو سەیری ئافرەتەکە ناکات. لە دەم و چاوی مستەربین وا دەخوێندراوە " ئەمە بەروانکەی من نیە !"

دوای خولەکێك شاگردەکە بە خۆی و خواردنەکەی مستەربین هات. سەرقاپێکی گەورە لەسەر خواردنەکە بوو مستەربین نەی دەتوانی خواردنەکە ببینێ . بەلام پارەکەی سەر مێزەکەی دایە شاگردەکە.



مستەربین دەستی بە جولاندنی بەروانکەکە کرد.

Customers don't *usually* give a waiter money when he arrives with the food. But the waiter didn't say anything. He took the money and put it in his jacket.

Mr Bean was happy. 'I'm doing everything right,' he thought. The waiter took the cover off the plate and walked away. Mr Bean looked at the food in front of him. He put his nose near the meat and smelled it. Then he put his ear next to it.

'What's this?' he thought.

He put some of the meat into his mouth. Suddenly, the manager arrived at his table.

'Is everything all right, sir?' he asked. 'Are you happy with the food?'

'Mmmmm,' said Mr Bean with a smile.

The manager smiled, too. He walked away - and Mr Bean's face changed. There was no smile now. 'Aaagh!' he thought. 'They didn't cook this meat!' But he had to eat it. 'I don't want people to think that I'm stupid,' he thought. 'But I'll never ask for steak tartare again! Never!'

He pushed his plate away.

But then the waiter went past his table.

'Is everything all right, sir?' he asked.

'Oh, yes,' said Mr Bean. He smiled. 'Yes, everything's very nice, thank you.'

He smiled and pretended to eat some meat. But the waiter went away before Mr Bean put it into his mouth.

'What can I do with it?' he thought. 'I can't eat this. Where can I hide it?'

Then he had an idea. Carefully, he put the meat into the sauce pot and put the cover on it. 'Where can I put some now?' he thought. 'I can't eat it, so I've got to hide all of it. Oh, yes, the flowers!' He took the flowers out of the vase. But then the manager went past, so Mr Bean pretended to smell the flowers.

بە شێوە یەکی ئاسایی مەعمیلەکان پارە نادەنە شاگردەکە کاتێ کە خواردن دێنێ. بەلام شاگردەکە هیچی نەگوت. پارەکەی وەرگرت و خستیە ناو چاکەتەکەی خۆی. مستەربین دلخۆش بوو . بیری کردەوە " من هەموو شتێك بە دروستی ئەنجام دەدەم ." شاگردەکە سەرقاپەکەی لابرد و ڕۆیشت . مستەربین سەیری خواردنەکەی بەردەمی خۆی کرد. لووتی خۆی لە گۆشتەکە نزیك کردەوە و بۆنی کرد. پاشان گوێی خۆی لە گۆشتەکە نزیك کردەوە .

مستەر بین بیری کردەوە:" ئەمە چی یە؟ "

پارچەیەکی لە گۆشتەکە کردە ناو دەمی خۆی. لە ناکاو بەڕێوبەرەکە هاتە لای مێزەکەی مستەربین.

بەڕێودبەرەکە پرسیاری کرد ،" گەورەم هەموو شتێك تەواوە ؟ ئایا بە چێشتەکە دلخۆشی؟"

مستەر بین بە زەردەخەنەوە گوتی:"مممممم"

بەڕێودبەرەکەش زەردەخەنەیەکی هاتە سەرلێو و ڕۆیشت، مستەر بین یەکسەر دەموچاوی گۆڕا. ئێستا هیچ زەردەخەنەی لەسەر نییە. بیری کردەوە:"ئخخ! ئەوانە گۆشتەکەیان نەکولاندووە!" بەلام ئەو دەبوایە گۆشتەکە بخوات. بیری کردەوە:"من نامەوێ خەلك وا بیر بکەنەوە کە من گەوجم. بەلام هەرگیز جارێکی دیکە داوای (ستەیك تاتەر) ناکەم! هەرگیز!"

مستەر بین قاپەکەی لادا ئەولاوە.

بەلام پاشان شاگردەکە بەلای مێزەکەیدا تێپەڕی.

پرسیاری لە مستەر بین کرد:" گەورەم، هەموو شتێك تەواوە، ؟"

مستەر بین بە زەردەخەنەوە گوتی:"ئۆی! بەلێ، هەموو شتێك تەواوە، سوپاست دەکەم"

مستەر بین زەردەخەنەیەکی کرد و وای نیشاندا کە هەندێ گۆشت دەخوا. بەلام پێش ئەوەی مستەر بین گۆشتەکە بخاتە ناو دەمی خۆی، شاگردەکە ڕۆیشت.

مستەر بین بیری کردەوە:"ئاخۆ چی لەم گۆشتە بکەم؟ من ناتوانم ئەمە بخۆم ئایا لە کوێ دەتوانم بیشارمەوە؟"

پاشان بیرۆکەیەکی بۆ هات. مستەر بین بە وریایی پارچەیەك لە گۆشتەکەی خستە ناو قوتوی ساسەکە و سەرەکەی خستەوە سەر. مستەر بین لە بیری خۆیدا گوتی:"ئێستا هەندێکی دیکە لە کوێ دابنێم؟ ناتوانم گۆشتەکە بخۆم، کەواتە پێویستە هەموو گۆشتەکە بشارمەوە. "ئا، بەلێ. لە ناو گولەکان!"مستەر بین گولەکانی لە ناو گولدانەکە دەرهێنا. بەلام پاشان بەڕێودبەرەکە بەلایدا تێپەڕی. لە بەرئەوە مستەر بین وای نیشاندا کە گولەکان بۆن دەکا.

---

فلیك : دەنگی کردنەوەی پارچە قوماشێکە کە قەد کرابێت.



*'Everything's all right, thank you.'*

'Mmm, very nice!' he said.
The manager smiled and walked away.
Quickly, Mr Bean put some meat into the vase and pushed the flowers in on top of it.
He looked round the table.

'Where next?' he thought. 'Yes! The bread!'
He took his knife and cut the bread round. Then he quickly ate the middle of it. He put some meat inside the bread, and then he put the bread down.
He looked at the meat on his plate. 'There's a lot of it,' he thought. 'Where can I hide it now?'

He looked at the small plate on the table. Perhaps he could hide some meat under the plate. He looked round. 'Nobody's watching me,' he thought. So he took more meat from the big plate in front of him, and put it under the small plate.



"هەموو شتێك تەواوە. سوپاست دەكەم"

مستەر بین گوتی: "مەم زۆر جوانە!"
بەرێوەبەرەكە زەردەخەنەیەكی كرد و رۆیشت.
مستەر بین بە خێرایی هەندێ گۆشتی خستە ناو گوڵدانەكە و گوڵەكانی لەسەر گۆشتەكەی ناو گوڵدانەكە داناوە.
مستەر بین سەیری دەوروبەری مێزەكەی كرد.
بیری كردەوە: "پاشان لە كوێ؟ بەڵێ لە ناو سەمونەكە" چەقۆیەكەی گرتە دەست و سەمونەكەی بە خڕی بڕی. پاشان بەخێرایی ناوە سەمونەكەی خوارد. هەندێ گۆشتی لە ناو سەمونەكە دانا و پاشان سەمونەكەی داناوە.
مستەر بین سەیری گۆشتەكەی سەر قاپەكەی كرد و گوتی: "زۆری گۆشت لەسەرە. ئێستا لە كوێ دەتوانم بیشارمەوە؟"
مستەر بین سەیری قاپە بچووكەكەی سەر مێزەكەی كرد. لە وانەیە بتوانێ هەندێ گۆشت لەژێر قاپەكە بشارێتەوە. سەیرێكی دەوروبەری خۆی كرد و بیری كردەوە: "كەس سەیرم ناكا"
كەواتە برێكی زیاتری لە گۆشتەكەی سەر قاپە گەورەكەی بەردەمی خۆی هێنا و لە ژێر قاپە بچووكەكەی دانا.



*Now he could push some meat inside the bread*

Then he pushed down hard with his hand.
The waiter walked past his table again. Mr Bean smiled at him and put his arm on the plate. After the waiter went away, he pushed down on the small plate again.

'That's better,' he thought. 'Now you can't see the meat. Good.
But there's more meat. Where can I hide it?'

He looked round the table.

'The sugar pot!' he thought. 'But it's got sugar in it. What can I do?' He thought quickly, and then he put some sugar into a wine glass. Next, he put some of the meat into the sugar pot. Then he put the sugar from the wine glass on top of it. 'Good!' he thought. 'Nobody can see it in there.' Suddenly, Mr. Bean could hear music.



ئێستا توانی هەندێ گۆشت بخاتە ناو سەمونەکە

پاشان مستەر بین بە دەستەکانی خۆی  قاپەکەی بە توندی داگرت.

شاگردەکە دیسانەوە بەلای مێزەکەیدا تێپەڕ بوو. مستەر بینیش زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و قۆلی خۆی خستە سەر قاپەکە. پاش ئەوەی کە شاگردەکە ڕۆیشت، ئەو دووبارە قاپە بچووکەکەی بە توندی داگرت.

مستەر بین بیری کردەوە:"ئەمە باشترە. باشە. ئێستا ناتوانێ گۆشتەکە ببینێ،

بەلاّم هێشتا گۆشتی زیاتر ماوە. ئاخۆ لە کوێ دەتوانم بیشارمەوە؟"

مستەر بین سەیرێکی دەوروبەری مێزەکەی کرد.

بیری کردەوە:"قوتووی شەکرەکە! بەلاّم شەکری تێدایە. ئایا چی بکەم؟"بەخێرایی بیری کردەوە، پاشان هەندێ شەکری کردە ناو گلاسی شەرابەکە. پاشان هەندێ گۆشتی کردە ناو قوتووی شەکرەکە. لە دوایيدا شەکرەکەی ناو گلاسی شەرابەکەی بەسەردا کردەوە. مستەر بین بیری کردەوە:"باشە! کەس ناتوانێ لەناو ئەوێدا بیبینێ" لەناکاو مستەر بین گوێی لە دەنگی مۆسیقا بوو.

'Where's that sound coming from?' he thought.
He looked round - and saw a man with a violin. After a minute or two, the man came across to Mr Bean's table and played for him.
Mr Bean smiled. 'This is nice,' he thought.
Then the man saw Mr Bean's birthday card, and he changed the music. The man started to play 'Happy Birthday'!
The people at the other tables looked round when they heard the song. 'Who's having a birthday?' they thought. Then they saw Mr Bean and smiled at him. Mr Bean smiled back at them.
He pretended to eat some of the meat, but he didn't put it into his mouth. The man with the violin walked round Mr Bean's table and watched him. He played his violin and waited for Mr Bean to eat the meat. And he waited. . . and waited. . . and waited...



*He waited... and waited... and waited...*

مستەر بین بیری کردەوە " ئەو دەنگە لە کوێوە دێت؟ "
مستەربین سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و پیاوێکی بینی کەمانچەیەکی پێبوو. دوای یەك دوو خولەك. پیاوەکە هاتە لای مێزەکەی مستەربین و مۆسیقای بۆ لێدا.
مستەربین زەردەخەنەیەکی کرد و بیری کردەوە " ئەمە خۆشە "
پاشان پیاوەکە کارتەکەی ڕۆژی لەدایك بوونی ( مستەربین ) ی بینی، و ئاوازەکەی گۆڕی.
پیاوەکە دەستی کرد بە ژەنینی مۆسیقای ( ڕۆژی لە دایك بونت پیرۆز!)
خەڵکەکەی سەر مێزەکانی تر کاتێك کە گوێیان لە ئاوازەکە بوو ئاوڕیان دایەوە. بیریان کردەوە" ئاخۆ یادی ڕۆژی لە دایك بوونی کێیە ؟ " پاشان ( مستەربین ) یان بینی و زەردەخەنەیەکیان بۆ کرد. مستەربینیش زەردەخەنەیەکی بۆ کردن. مستەربین وای نیشاندا کە هەندێ لە گۆشتەکە دەخوات، بەڵام گۆشتەکەی نەکردە ناو دەمی خۆی. پیاوەکەی کەمانچەی پێ بوو لە دەوری مستەربین دەسوڕایەوە و سەیری دەکرد. ئەو کەمانچەکەی دەژەنی و چاوەڕێی مستەربینی دەکرد تا گۆشتەکە بخوات . ئینجا چاوەڕێی کرد و ... اوەڕێی کرد و ... چاوەڕێی کرد ...



چاوەڕێی کرد و .. چاوەڕێی کرد و .. چاوەڕێی کرد ...

'I'll have to eat some,' thought Mr Bean. 'He'll only go away when I eat it.' So he put the meat into his mouth. And the man with the violin turned away to the next table. The meat was in Mr Bean's mouth, but he didn't want to *eat* it. He wanted to put it somewhere. But where? He looked at the man with the violin. He moved quickly. He pulled open the back of the man's trousers and opened his mouth. The meat fell inside the trousers! He smiled. 'That was clever,' he thought.

The man with the violin moved round the next table. He played a song to the man and the woman. The music was very beautiful. They listened and drank their wine. They watched the man with the violin, so their eyes weren't on Mr Bean. *Nobody's* eyes were on Mr Bean. He saw this, and he had an idea.

Mr Bean quickly took the woman's bag from the floor. He opened it and pushed some meat inside it. Then he put the bag on the floor again. But when he did this, he accidentally put his foot out. The waiter walked past with some plates of food - and he fell over Mr Bean's foot! The plates fell on to Mr Bean's table, and on to the floor. There was a loud *CRASH!*, and the people at the other tables looked up quickly. 'What happened?' they said.

Then they saw the waiter on the floor. 'Oh, dear!' they said. Now Mr Bean had another idea. Here was the answer to his problem! He moved very quickly. He pushed the meat from his plate on to the table with the other food. Then he pretended to be very angry. 'Look, you stupid man!' he said to the waiter. 'Oh, look at this!' The waiter got up from the floor.

مستەربین بیری کردەوە " وا پێویستە کە هەندێکی لێ بخۆم، ئەو پیاوە تەنها کاتێك لادەچێ کە من گۆشتەکە دەخۆم" لەبەر ئەوە مستەربین گۆشتەکەی کردە ناو دەمی خۆی. ئینجا پیاوەکەی کەمانچەی پێ بوو ڕووی کردە مێزەکەی تەنیشتەوە. گۆشتەکە لە ناو دەمی مستەربین بوو ، بەڵام ئەو نەی دەویست بیخوات. ویستی بیخاتە شوێنێك . بەڵام کوێ ؟ مستەربین سەیری پیاوەکەی کرد کە کەمانچەکەی پێ بوو . بە خێرایی جوڵایەوە و پشتی پانتۆڵی کابرای کردەوە و ئینجا دەمی خۆی کردەوە . گۆشتەکە کەوتە ناو پانتۆڵەکە! مستەربین زەردەخەنەیەکی کرد. بیری کردەوە " ئەمە کارێکی زیرەکانە بوو "

پیاوەکەی کەمانچەکەی پێ بوو لە دەوری مێزەکەی تر دەسوڕایەوە . ئاوازێکی بۆ پیاوەکە و ئافرەتەکەی سەر مێزەکە دەژەنی . ئاوازەکە زۆر خۆش بوو . ئەوانیش گوێیان لێ گرتبوو و شەرابەکانیان دەخواردەوە . هەردووکیان سەیری پیاوە بە کەمانچەکەیان دەکرد . کەواتە چاوەکانیان لە سەر مستەربین نەبوو . کەس چاوی لەسەر مستەربین نەبوو. مستەربین ئەمەی بینی و بیرۆکەیەکی بۆ هات.

مستەربین بە خێرایی دەستی دایە جانتای ئافرەتەکە کە لەسەر ئەرزەکە بوو. جانتاکەی کردەوە و هەندێ گۆشتی لەناو دانا. پاشان جانتاکەی لەسەر ئەرزەکە داناوە . بەڵام کاتێ کە مستەربین ئەمەی کرد، بەبێ ئەوەی ئاگای لێ بێ قاچی خۆی لەولاوە درێژ کردبۆوە . شاگردەکەش بە وێدا تێپەڕی و هەندێ قاپی پڕ لە خواردنی پێ بوو – پاشان شاگردەکە بەسەر پێی (مستەربین)دا بەربۆوە ! قاپەکان کەوتنە سەر مێزەکەی مستەربین و سەر ئەرزەکە . دەنگێکی زۆر گەورەی لێوە هات و خەڵکەکانی سەر مێزەکانی تر بە خێرایی سەریان بەرزکردەوە و سەیریان کرد . گوتیان " چی ڕوویدا ؟ "

پاشان شاگردەکەیان لەسەر ئەرزەکە بینی و گوتیان " ئەی خوایە ! "

ئێستا مستەربین بیرۆکەیەکی تری بۆ هات . ئەمەش وەڵامەکەیە بۆ کێشەکەی ! مستەربین زۆر بە خێرایی جوڵا . گۆشتەکەی ناو قاپی خۆی لەگەڵ خواردنەکانی تری سەر مێزەکەی خۆی تێکەڵ کرد. پاشان مستەر بین وای نیشاندا وەکو ئەوەی کە زۆر توڕە بووبێ. بە شاگردەکەی گوت: " سەیرکە هەی گەوجە پیاو . ئای سەیری ئەمە کە ! " شاگردەکە لە سەر ئەرزەکە هەڵسایەوە.

'I'm sorry, sir,' he said. 'I'm really *very* sorry.'
The manager arrived at the table. 'I'm very sorry, too, sir,' he said. 'Oh, the food-!'
'Yes, it's everywhere!' said Mr Bean. 'Look! It's in the souce pot. It's in the bread roll. It's in the vase of flowers.' He took the woman's bag from the floor. 'And it's in here!' He pulled open the back of the violin player's trousers. 'And *here!*'

The waiter couldn't understand it.
'Go back to the kitchen,' the manager told him, and the waiter went away. Then the manager turned. Mr Bean. 'Please, sir,' he said. 'Come with me.' 'What?' said Mr Bean. 'Oh, yes, all right.'
The manager took Mr Bean to a clean table. 'Sit here, sir,' he said. Mr Bean sat down.



*"It's everywhere!" said* Mr. *Bean "Look!"*

شاگردەکە گوتی " گەورەم بمبورە ، بەراستی زۆر داوای لێبوردن دەکەم "

بەڕێوبەرەکە گەیشتە سەر مێزەکە و گوتی " گەورەم . منیش هەروەها زۆر داوای لێبوردن دەکەم. ئای ، خواردنەکە ! "

مستەربینیش گوتی:"بەڵێ ،گۆشتەکە لە هەموو شوێنێکە . سەیرکە ! گۆشتەکە لەناو قوتوی ساسەکەیە. لە ناو سەمونەکەیە ، لە ناو گوڵدانەکەیە! " مستەربین جانتای نافرەتەکەی هێناو گوتی " ئێرەش ! " مستەربین پشتەوەی پانتۆڵی کەمانجە ژەنەکەی ڕاکێشا و گوتی:"هەروەها ئێرەش ! " شاگردەکە لەمە تێنەدەگەیشت.

بەڕێوبەرەکە بە شاگردەکەی گوت:"بگەڕێوە چێشتخانەکە " شاگردەکەش ڕۆیشت . پاشان بەڕێوبەرەکە ڕووی کردەوە مستەربین و گوتی " گەورەم، تکا دەکەم. فەرموو لەگەڵم وەرە "

مستەربین گوتی " چی ؟ ئا بەڵێ ، زۆر باشە "

بەڕێوبەرەکە مستەربینی بۆ سەر مێزێکی پاك و خاوێن برد، گوتی: " گەورەم لێرە دانیشە " مستەربینیش دانیشت .



مستەر بین گوتی:"گۆشتەکە لە هەموو شوێنێکە. سەیرکە..."

'Thank you,' he said.

The manager opened Mr Bean's napkin. Then he got the birthday card from the other table. He put it on Mr Bean's clean table. 'Thank you,' said Mr Bean.

The man with the violin came across and played 'Happy Birthday' to him again. Mr Bean smiled. Now everything is 'Now I can start again,' he thought. 'And this time I'll do everything right.'

The waiter arrived at Mr Bean's table. He put a plate in front of Mr Bean. The manager smiled and took off the cover.
Mr Bean looked down. And he stopped smiling. There, in front of him, was a very large plate - of steak tartare!



*There, in front of him, was a very large plate - of steak tartare!*

مستەربین گوتی:" سوپاست دەكەم "

بەڕێوبەرەكـە بەروانكەكـەی بـۆ مـستەربین كـرددوە . پاشـان كارتەكـەی ڕۆژی لـەدایك بـوونی لـە مێزەكەی ترەوە هێنا و لەسەر مێزە خاوێنەكەی مستەربینی دانا .

مستەربین گوتی " سوپاست دەكەم "

پیاوەكەی كەمانچەی پێ بوو نزیك بووەوە و دووبارە ئاوازی ( ڕۆژی لە دایـك بوونـت پـیرۆز )ی بـۆ لێدا . مستەربین زەردەخەنەیەكی كرد . ئێستا هەموو شتێ دروستە . مـستەربین بـیری كـرددوە " ئێستا دەتوانم دووبارە دەست پێ بكەم ، وە ئەمجارە هەموو شتێ بە دروستی دەكەم"

شاگردەكە گەیشتە سەر مێزی مستەر بین. قاپێكی لە بەردەمی مستەر بـین دانـا. بەڕێوەبەرەكـەش بە زەردەخەنەوە سەرقاپەكەی لادا.

مستەر بین سەیری خواردەوەی كرد و لە زەردەخەنەكەی وەستا. لـە بـەردەمی مـستەر بـین قـاپێكی زۆر گەورەی پڕ لە (ستەیك تاتەر) هەبوو!



لە بەردەمی مستەر بین قاپێكی گەوردی پڕ لە (ستەیك تاتەر) هەبوو.

## The Launderette

A lot of Mr Bean's clothes were dirty.

'I'll go to the launderette this morning,' he thought. 'I'll take the car.' He put his dirty clothes into a very large black bag, and put the bag into his car. He put it inside. Then he got in and drove to the launderette.

The launderette wasn't very busy that morning. Before Mr Bean arrived, there were only two women there. The young woman was speaking to the launderette manager.

'I've got to wash a lot of clothes,' the young woman said to the manager. 'I'll want a big washing machine.'

'This is one of our bigger machines,' said the manager. 'Use this.'

At that minute, Mr Bean arrived. He had the black bag on his back, and he couldn't get it through the launderette door.

'Oh!' he said.

He pulled and he pushed. He pushed and he pulled. In the end, he got the bag inside. He took it across to one of the washing machines.

'Money,' he thought. 'I want two one-pound coins for the washing machine.'

He took two one-pound coins out of his jacket and put them on the top of the machine.

But then Mr Bean saw a note above the washing machine: *Machines now cost* £3.

'Oh, no!' thought Mr Bean. 'Have I got another one-pound coin?'

He looked in his jacket and his trousers, but he could only find a five-pence coin. He put this on top of the washing machine.

Then Mr Bean remembered something. He *did* have another one-pound coin, but. . . He looked round.

# شوێنی جل شوشتن

زۆربەی جلەکانی مستەر بین پیس بوون.
مستەر بین بیری کردەوە:"ئەم بەیانیە دەچمە شوێنی جل شۆر و سەیارەکەشم دەبەم"
مستەر بین جلە پیسەکانی خۆی کردە ناو جانتایەکی ڕەشی زۆر گەورە و جانتاکەشی خستە ناو سەیارەکەی خۆی. پاشان سواری سەیارەکە بوو بەرەو شوێنی جل شۆرەکە بەڕێ کەوت.
ئەو بەیانیە شوێنی جل شۆرەکە زۆر قەرەباڵغ نەبوو. پێش ئەوەی مستەر بین بگاتە جێ تەنها دوو ئافرەت لەوێ بوون. ئافرەتە گەنجەکە لەگەڵ بەڕێوەبەری شوێنی جل شوشتنەکە قسەی دەکرد.
ئافرەتە گەنجەکە بە بەڕێوەبەرەکەی دەگوت:"من جلی زۆرم هەیە کە پێویستە بیانشۆرم، لەبەر ئەوە ئامێرێکی جل شوشتنی گەورەم دەوێ"
بەڕێوەبەرەکە گوتی:"ئەمە یەکێکە لە گەورەترین ئامێرەکانمان. ئەمە بەکاربێنە"
لەوکاتەدا مستەر بین گەیشتە جێ و جانتا ڕەشەکەی بە پشتی خۆیدا دابوو، بۆیە نەیدەتوانی بە دەرگای دوکانەکەدا بێتە ژوورەوە.
مستەر بین گوتی:"ئۆها!"
جانتاکەی ڕادەکێشا و پاڵیدەدا. پاڵیدەدا و ڕایدەکێشا. لە کۆتاییدا، جانتاکەی هێنایە ژوورەوە.
مستەر بین جانتاکەی بەرەو لای یەکێك لە ئامێرەکان برد.
بیری کردەوە:"پارە. من پێویستم بە دوو پارەی یەك پاوەندی هەیە بۆ جل شۆرەکە"
مستەر بین دوو پارەی یەك پاوەندی لەناو چاکەتەکەی خۆی دەرهێنا و لەسەر ئامێرەکە داینا.
بەڵام پاشان مستەر بین تێبینییەکی لەسەر جل شۆرەکە بینی : جل شوشتن بە سێ پاوەندە.
مستەر بین بیریکردەوە:"ئای ، نا! ئایا پارەیەکی یەك پاوەندی ترم پێیە؟"
مستەر بین لە ناو چاکەتەکە و پانتۆڵەکەی خۆی گەڕا، بەڵام تەنها پارەیەکی پێنج پێنسی دۆزییەوە. ئەوشی لەسەر جل شۆرەکە دانا.
پاشان مستەر بین شتێکی بیر کەوتەوە. لەڕاستیدا ئەو پارەیەکی یەك پاوەندی تری هەبوو، بەڵام ... مستەر بین سەیرێکی دەوروبەرەکەی کرد.



*He started to pull out some string*

The young woman was next to the big washing machine. Mr Bean saw her putting some clothes into it. The launderette manager was busy in his little office.

'Nobody's watching me,' thought Mr Bean. 'Good.'

He opened the front of his trousers. Then he started to pull out some string.

The young woman turned suddenly and saw Mr Bean pulling the string out of his trousers.

'What *is* that man doing?' she thought.

Mr Bean saw her looking and turned away quickly.

But now the older woman looked at him. Her eyes opened wide. 'That's a strange man' the woman thought. 'He's got *string* inside his trousers!'

On the end of the string was some paper, and inside the paper was a one-pound coin. Mr Bean smiled and took the coin out of the paper and put it on the top of the washing machine.



مستەر بین دەستی کرد بە ڕاکێشانی داوێك

ئافرەتە گەنجەکە لە تەنیشت جل شۆرە گەورەکەوە بوو. مستەر بین ئەوی بینی کەوا هەندێ جل دەخاتە ناو جل شۆرەکە. بەڕێوەبەری شوێنەکە لە نوسینگە بچووکەکەی خۆی سەرقاڵ بوو.
مستەر بین بیری کردەوە:"باشە. کەس سەیرم ناکات"
زنجیری پانتۆڵەکەی خۆی کردەوە. پاشان دەستی کرد بە ڕاکێشانی داوێك لەناو پانتۆڵەکەی خۆی.
ئافرەتە گەنجەکە لەناکاو ئاوڕی دایەوە و مستەر بینی دیت کەوا داوێك لەناو پانتۆڵەکەی خۆی ڕادەکێشێتە دەرەوە.
ئافرەتەکە بیری کردەوە:"ئاخۆ ئەو پیاوە چی دەکا؟"
مستەر بین بینی کە ئافرەتەکە وا سەیری دەکا بەخێرایی ڕووی خۆی سوڕاند.
بەڵام ئێستا ئافرەتە پیرەکە سەیری کرد. ئافرەتەکە چاوی زەق بۆوە. بیری کردەوە:"ئەوە پیاوێکی نامۆیە. ئەو پیاوە داوێکی لەناو پانتۆڵەکەیدا هەیە!"
لە کۆتایی داوەکە کاغەزێك هەبوو وە لەناو کاغەزەکەش پارەیەکی یەك پاوەندی هەبوو. مستەر بین زەردەخەنەیەکی کرد و پارەکەی لەناو کاغەزەکە دەرهێنا و کردیە ناو ئامێری جل شۆرەکە.

Then he put the five-penny coin back into his jacket. Next, he opened the washing machine.

A man came into the launderette with a bag of dirty clothes under his arm. He was young and strong. When he saw Mr Bean, he smiled. But it wasn't a nice smile. He didn't say 'Hello' or 'Good morning'. He pushed Mr Bean away from the washing machine.
'What-!' began Mr Bean
Then the young man pushed Mr Bean's one-pound coins on to the next machine. Mr Bean was angry. He turned round to speak angrily, but then he saw the young man taking a white karate suit out of his bag.
'A karate suit!' thought Mr Bean. 'So he can fight. It's better not to say anything''



*'A karate suit!'*

پاشان مستەر بین پارە پێنج پێنی یەکەی لەناو چاکەتەکەی خۆی داناوە. پاشان مستەر بین جل شۆرەکەی کردەوە.

پیاوێك هاتە شوێنی جل شوشتنەکە و جانتایەکی پڕلە جلی سپی لە ژێر قۆڵی خۆی دانابوو.

پیاوێکی گەنج و بە هێز بوو. کاتێ چاوی بە مستەر بین کەوت زەردەخەنەیەکی هاتە سەر لێو. بەلاّم زەردەخەنەیەکی دلّخۆش کەر نەبوو. پیاوەکە نەیگوت "چۆنی" یاخود " بەیانی باش ". بەلکو لە بەردەم جل شۆرەکە پالێکی بە مستەر بین وەنا.

مستەر بین دەستی پێکرد :" چی؟"

پاشان پیاوە گەنجەکە پارە پەك پاوەندیەکانی مستەر بینی خستە سەر نامێرەکەی تەنیشتەوە.

مستەر بین تورە بوو. ڕووی خۆی سوڕاندەوە و ویستی بەتوڕەیی قسە بکات. بەلاّم پاشان پیاوە گەنجەکەی بینی کە بەدلەیەکی کاراتی سپی لەناو جانتاکەی خۆی دەردێنێ.

مستەر بین بیری کردەوە :"بەدلەیەکی کاراتی ! کەواتە دەتوانێ شەر بکا. وا باشترە منیش هیچ نەلێم"



"بەدلەیەکی کاراتی!"

The young man put his white karate suit into the washing machine. Then he put some money into the machine and sat down on a chair. He took a magazine out of his bag and began to read.

Mr Bean put his clothes into his washing machine.There were some pairs of underpants.

'Monday,' he said, and he put one pair into the machine. 'Tuesday.' He put the next pair into the machine. 'Thursday. Friday. Saturday.' Three pairs went into the machine. Mr Bean stopped. 'Wednesday!' he thought. 'Where are Wednesday's underpants? Oh, it's Wednesday today, and I'm wearing them!'

What could he do? He had to wash them, so he had to take them off. He looked round.

'Where can I go?' he thought.

There was a partition near the washing machines'. 'I'll go behind that,' he thought. He walked to the partition, but the young man put his legs on the way. He wanted to make Mr Bean angry. But Mr Bean remembered the karate suit. The man could fight! He walked round the young man's legs and said nothing.

He went behind the partition and carefully took off his brown Trousers. The young woman put some of her clothes into one of the very big washing machines. The other clothes were on the top of a smaller machine near the partition.

She didn't watch her clothes very carefully. She didn't see Mr Bean put a hand round the partition. And she didn't see him put his brown trousers down with her clothes.

Mr Bean took off his underpants - Wednesday's underpants. Then he put his hand round the partition. He took something but it *wasn't* his brown trousers. It was a long brown skirt.

پیاوە گەنجەکە جلەکانی کاراتی خۆی لەناو جل شۆرەکە دانا . پاشان هەندێ پارەی کردە ناو ئامێرەکە و لەسەر کورسییەك دانیشت. گۆڤارێکی لەناو جانتاکەی خۆی دەرهێنا و دەستی بە خوێندنەوە کرد.

مستەر بینیش جلەکانی خۆی خستە ناو جل شۆردکەی خۆی. لەناو جلەکانی هەندێ شۆرتی تێدا بوو.

مستەر بین گوتی:"دووشەممە"و شۆرتێکی خستە ناو جل شۆرەکە"پێنج شەممە، هەینی، شەممە" سێ شۆرتی دیکەی خستە ناو جل شۆرەکەوە. مستەر بین وەستا و بیری کردەوە:"چوار شەممە! کوا شۆرتی چوار شەممە؟ ئۆی ، ئەمڕۆ ڕۆژی چوار شەممەیە وا لەبەرم کردووە!"

ئاخۆ مستەر بین دەبێ چی بکات؟ ئەو دەبوایە شۆرتەکان بشوا، کەواتە پێوست بوو کە لەبەری بکاتەوە. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد.

مستەر بین بیری کردەوە:"ئایا بچمە کوێ؟"

لە نزیك جل شۆرەکان پەردەیەك هەبوو. مستەر بین بیری کردەوە:"دەچمە پشت ئەوە" مستەر بین بەرەو پەردەکە ڕۆیشت ، بەلام پیاوە گەنجەکە قاچەکانی خۆی لە سەر ڕێگاکە دانا بوو. دەیویست مستەر بین تورە بکا. بەلام مستەر بین بەدلەکەی کاراتی بەبیر هاتەوە . پیاوەکە دەتوانێ شەر بکات! مستەر بین بەدەوری قاچی کابراکە سوڕایەوە و هیچیشی نەگوت.

مستەر بین چووە پشت پەردەکە و بە وریایی پانتۆڵە قاوەیی یەکەی خۆی لە بەر کردەوە.

ئافرەتە گەنجەکەش جلەکانی خۆی خستە ناو یەکێك لە جل شۆرە گەورەکان و جلەکانی تریش لەسەر جل شۆرێکی بچووکتری نزیك پەردەکە بوون.

ئافرەتەکە زۆر بە وریای ئاگاداری جلەکانی خۆی نەبوو. ئەو نەیبینی کە مستەر بین دەستی خۆی لە دەورەی پەردەکە سوڕاندبووەوە. هەروەها ئەوەشی نەبینی کە مستەر بین پانتۆڵە قاوەیی یەکەی خۆی لەگەڵ جلەکانی ئەودا دانا.

پاشان مستەر بین شۆرتەکەی لەبەر کردەوە شۆرتی ڕۆژی چوار شەممە. پاشان دەستی خۆی لە دەورەی پەردەکە درێژ کرد و شتێکی گرتە دەست. بەلام ئەو شتە پانتۆڵە قاوەیی یەکەی خۆی نەبوو. بەڵکو تەنورەیەکی درێژی قاوەیی بوو.



*It was a long brown skirt.*

Mr Bean put on the skirt and came out from behind the partition. He walked back to his washing machine.

The young woman took the brown trousers from the top of the smaller washing machine, but she didn't look at them. She put them into the big machine. Next, she shut the door of the machine and took a magazine. Then she sat down on a chair near the dryers and started to read. She had her back to Mr Bean, so she didn't see him wearing her skirt.

Mr Bean put his Wednesday underpants into his washing machine. Then he closed the door and put in his three one pound coins.

When he sat down on a chair - he saw the skirt!

'Oh, no!' he thought. 'What's this? A skirt? Where are my trousers?'



تەنورەیەکی درێژی قاوەیی بوو.

مستەر بین تەنورەکەی لەبەر کرد و لە پشت پەردەکەوە دەچوو. گەڕایەوە بۆ لای جل شۆرەکەی خۆی.

ئافرەتە گەنجەکە پانتۆڵە قاوەیی یەکەی لەگەڵ جلەکانی سەر جل شۆرە بچووکەکە هەلگرت. بەلاّم ئافرەتەکە سەیری پانتۆڵەکەی نەکرد. پانتۆڵەکەی خستە ناو جل شۆرە گەورەکە. پاشان ئامێرەکەی داخست. گۆڤارێکی گرتە دەست و لەسەر کورسیەکی نزیك ووشك کەرەوەکان دانیشت و دەستی کرد بە خوێندنەوە. ئافرەتەکە پشتی لە مستەر بین بوو، کەواتە نەیبینی کەوا مستەر بین تەنورەکەی ئەوی لەبەر کردووە.

مستەر بین شۆرتەکەی چوار شەممەی خستە ناو جل شۆرەکەی خۆی. دەرگاکەی داخست و سێ پارە یەك پاوەندی یەکانی کردە ناو ئامێرەکە .

کاتێك کە مستەر بین لەسەر کورسیەك دانیشت -تەنورەکەی بینی!

بیری کردەوە:"ئای ، نا! ئەمە چی یە ؟ تەنورە ؟ ئەی کوا پانتۆڵەکەم ؟"

The young man walked past him, and Mr Bean tried to hide the skirt with his hands.

'I don't want him to see me in this skirt,' he thought. 'What will he think?'

The young man went across to a machine on the wall and bought a cup of conditioner.

Mr Bean got up and went back to the partition. He looked at the washing machine next to it and remembered the young woman's clothes.

'She put my trousers in the big washing machine with her things!' he thought.

He went across to the big washing machine and tried to open it. But he couldn't do it. 'I'll have to wait,' he thought, then he walked back to his chair.

The young man put his cup of conditioner on the top of his washing machine. Then he looked at Mr Bean - and saw the skirt. He started to laugh.

Mr Bean looked away quickly. He got his black bag - and a pair of underpants fell out of it.

'Oh! Sunday's underpants!' he said.

Then he tried to stop his washing machine and open the door. But the machine didn't stop.

'What can I do?' he thought. He looked down at the skirt. 'I know! I'll wear Sunday's underpants under this skirt! That's a good idea.'

He looked round, and then went across to the conditioner machine, away from the other people. Carefully, he started to put on Sunday's underpants. He put his feet into them and - suddenly, he couldn't pull them up. He couldn't move them. There was a strange foot on them! It was the young man's foot. Mr Bean turned round and saw the young man laughing at him.

پیاوە گەنجەکە بەلایدا تێپەڕی و مستەر بینیش ویستی بە دەستەکانی خۆی تەنورەکە بشارێتەوە.

مستەر بین بیری کردەوە:" من نامەوێ ئەو پیاوە لەو تەنورەیەدا بمبینێ، ئایا دەبێ بیری چی دەکاتەوە؟"

پیاوە گەنجەکە چووە لای ئامێرێك کە بە دیوارەکەوە بوو و کوپێك شامپۆی کڕی.

مستەر بینیش هەڵسایەوە و چۆوە لای پەردەکە. سەیری جل شۆرەکەی نزیکیەوەی کرد و جلەکانی ئافرەتە گەنجەکەی بیر کەوتەوە.

بیری کردەوە :"ئەو پانتۆڵەکەی منی لەگەڵ شتەکانی خۆی لەناو جل شۆرە گەورەکە داناوە!"

مستەر بین چووە لای جل شۆرە گەورەکە و هەوڵیدا بیکاتەوە. بەڵام نەیتوانی بیکاتەوە.

بیری کردەوە :"دەبێ چاوەڕێ بکەم " پاشان گەڕایەوە لای کورسیەکەی خۆی.

پیاوە گەنجەکە کوپە شامپۆکەی لەسەر جل شۆرەکەی خۆی دانا . پاشان سەیری مستەر بینی کرد و تەنورەکەی بینی . پیاوەکە دەستی کرد بە پێکەنین.

مستەر بین بەخێرایی ڕووی خۆی کردە ئەولاوە. مستەر بین جانتا ڕەشەکەی خۆی هێنا شۆرتێکی تری لێ کەوتە خوارەوە.

مستەر بین گوتی:"ئۆی ! شۆرتی یەك شەممە!"

پاشان هەولی دا کە جل شۆرەکە بوەستێنێ و دەگاکەی بکاتەوە. بەڵام ئامێرەکە نەوەستایەوە.

مستەر بین بیری کردەوە:" چی دەتوانم بکەم؟" سەیرێکی تەنورەکەی کرد. "دەزانم ! شۆرتەکەی یەك شەممە لە ژێر ئەو تەنورەیە لەبەر دەکەم! ئەمە بیرۆکەیەکی چاکە!"

مستەر بین سەیرێکی دەوروبەرەکەی کرد و پاشان چووە لای ئامێرەکەی فرۆشتنی شامپۆ ، دوور لە خەڵکی تر. بە وریایی دەستی کرد بە لەبەر کردنی شۆرتی یەك شەممە. مستەر بین پێیەکانی خۆی تێهەڵکێشا -- لەناکاو، نەیدەتوانی بە تەواوی هەڵی بکێشێ. نەیدەتوانی شۆرتەکە بجولێنێ. سەیری کرد پێیەکی ئامۆ لەسەر شۆرتەکە یە! پێی پیاوە گەنجەکە بوو. مستەر بین ڕووی خۆی سوڕاندەوە و پیاوە گەنجەکەی بینی کە وا پێی پێدەکەنێ.



*"What can I do?'*

Mr Bean wanted to shout and say 'Go away, you stupid man!' but he was too afraid.

After a minute, the young man laughed again and went back to his chair. Mr Bean quickly pulled up Sunday's underpants. He was angry.

'I don't like people laughing at me,' he thought, and he looked at the young man. 'What can I do to him? I can't fight him, because he's too strong.'

Then he had an idea.

There was a coffee machine next to the machine for conditioner. Mr Bean went across to it and got a cup of black coffee.

He smiled and walked back to his washing machine with the coffee.



"ئاخۆ چی بکەم؟"

مستەر بین ویستی هاوار بکات و بڵێ:" برۆ ئەولاوە هەی گەوجە پیاو !" بەڵام زۆر دەترسا.

دوای خولەکێك پیاوە گەنجەکە دووبارە پێکەنی و چۆوە لای کورسیەکەی خۆی. مستەربینیش بە خێرایی شۆرتی یەکشەمەی هەڵکێشا. زۆر تورە ببوو.
مستەر بین بیری کردەوە " من حەز ناکەم خەڵك پێم پێبکەنن "
پاشان سەیری پیاوە گەنجەکەی کردەوە." ئاخۆ دەتوانم چی لە دژی بکەم ؟ من ناتوانم شەڕی لەگەڵ بکەم، چونکە ئەو زۆر بەهێزە"
پاشان مستەر بین بیرۆکەیەکی بۆ هات.
لە تەنیشت ئامێری شامپۆکە ئامێرێکی فرۆشتنی قاوە هەبوو. مستەر بین چووە لای ئامێرەکە و کوپێك قاوەی ڕەشی هێنا. زەردەخەنەیەکی کرد و گەڕایەوە لای ئامێری جل شۆرەکەی خۆی و قاوە کەشی پێ بوو.



Mr *Bean carried the cup of conditioner to his chair.*

The young man's eyes were on his magazine. He didn't look at Mr Bean or the washing machine.

'Now!' thought Mr Bean

And he quickly changed the young man's cup of conditioner for his cup of black coffee. Then he carried the cup of conditioner to his chair and sat down.

'That will teach him a good lesson,' he thought with a smile.

After a minute, the young man stood up and went to his machine. He had to put the conditioner into it now. He stood next to the machine and laughed at Mr Bean's skirt. So he didn't look at the cup when he put the' conditioner' into the top of his washing machine.

But, of course, it wasn't conditioner. It was black coffee.



مستەر بین کوپە شامپۆکەی هەلگرت و هاتەوە لای کورسیەکەی خۆی.

چاوەکانی پیاوە گەنجەکە لەسەر گۆڤارەکەی خۆی بوو. نە سەیری مستەر بین و نە سەیری ئامێری جل شۆرەکەی نەدەکرد.
مستەر بین بیری کردەوە " ئێستا ! "
ئینجا بە خێرایی کوپە شامپۆکەی پیاوە گەنجەکەی بە کوپە قاوە ڕەشەکەی خۆی گۆڕی یەوە .
پاشان کوپە شامپۆکەی هەلگرت و هاتەوە لای کورسی یەکەی خۆی و دانیشت.
مستەر بین بە زەردەخەنەیەکەوە بیری کردەوە " ئەمە دەرسێکی باشی دەدات "
دوای خولەکێك پیاوە گەنجەکە هەڵسایەوە و چووە لای ئامێرەکە. ئێستا دەبوایە شامپۆکە لەناو ئامێرەکە بکات . پیاوەکە لە تەنیشت ئامێرەکەی وەستا و بە تەنورەکەی مستەر بین پێ دەکەنی.
کەواتە ئەو سەیری کوپەکەی نەدەکرد کاتێ کە (شامپۆ) کەی تێ کردە ناو ئامێری جل شوردکە.
بەلأم بێ گومان ، شامپۆ نەبوو . بەڵکو قاوەی ڕەش بوو.

Mr Bean tried not to laugh.

The young man sat down in his chair again and looked across at his washing machine. There was a window in the door, and the young man could see his white karate suit going round and round in the water. But the suit wasn't white now. It was brown!

'What- !?' he shouted

He jumped up. He ran across to the cup and looked inside it.

Then he put it to his nose and smelled it.

'Coffee!' he shouted. Then he looked across at Mr Bean and said "Did ...you...?"

Mr Bean didn't answer, but his face said, 'Who, me?' He pretended to drink his cup of 'coffee'. But it wasn't coffee, it was conditioner.

The young man went to find the launderette manager. Mr. Bean stopped drinking and said, 'Aaaagh!'



Mr *Bean pretended to drink his cup of 'coffee'*

مستەر بین هەوڵیدا کە پێ نەکەنێ .

پیاوە گەنجەکە لە سەر کورسی یەکەی خۆی دانیشتەوە و سەیری ناو نامێری جل شۆردەکەی خۆی کرد. دەرگاکە جامێکی پێوە بوو و پیاوە گەنجەکە دەیتوانی جلە سپیەکانی کاراتی خۆی ببینێ کە لە ناو ناوەکە دەسوڕایەوە . بەلأم ئێستا جلەکەی سپی نیە. بەلکو قاوەیی بوو!

پیاوەکە هاواری کرد: " چی ؟! "

بازی داو چووە لای کوپەکە و سەیری ناوەوەی کرد. پاشان لە لوتی خۆی نزیك کردەوەو بۆنی کرد.

هاواری کرد :" قاوە ! " پاشان پیاوەکە سەیری مستەر بینی کرد و گوتی " ئایا... تۆ ... ؟"

مستەر بین وەڵامی نەدایەوە . بەلأم دەم و چاوی دەی گوت " کێ، من ؟ " مستەر بین وای نیشاندا کە کوپە قاوەکەی خۆی دەخواتەوە. بەلأم قاوە نەبوو بەلکو شامپۆ بوو.

پیاوە گەنجەکە ڕۆیشت تاکو بەڕێوبەری شوێنی جل شۆردەکە بدۆزێتەوە . مستەر بین لە خواردنەوە وەستاو گوتی " ئخخ "



مستەر بین وای نیشاندا کە کوپە (قاوە) کەی خۆی دەخواتەوە.

The young man showed the brown karate suit to the, launderette manager. 'What's wrong, sir?' said the manager.
'This karate suit was white when I came in here,' said the young man 'Now look at it!"
'What did you do to it?' said the manager.
'Me? I didn't do anything to it,' said the young man, angrily' He pulled the manager across to his washing machine. 'This is your machine. Is that right?"
'Yes,' said the manager.
The young man showed him the karate suit again.
'This cost me two hundred pounds!' he said." What are you going to do about it?"
'Will you come to my office please, sir?' said the manager.
'We can talk about it there."
Mr Bean sat opposite a large dryer. His underpants and other things were in the machine. They were clean now, and nearly dry.
Mr Bean waited.
After a minute, the dryer stopped. He got up and opened the door. Then he started to take out his clothes.

A minute or two later, the young woman came to the next dryer and started to take out her clothes. They were dry, too.

'Perhaps my trousers are in there!' thought Mr Bean.
The young woman took some clothes out of the machine and put them into a bag. Then she went back to the big washing machine for her other clothes.

Mr Bean moved quickly. He started to look through her clothes for his trousers, but he couldn't find them.

'Where are they?' he thought. 'They're here somewhere. Wait! Perhaps she left them in the dryer.'
So he looked inside it. First, he put his head into the machine

پیاوە گەنجەکە، بەدلە قاوەییەکەی کاراتی بە بەڕێوبەری شوێنی جل شۆرەکە نیشاندا.
بەڕێوبەرەکە گوتی:" گەورەم چی ڕوویداوە ؟ "
پیاوە گەنجەکە گوتی :" ئەو بەدلەیەی کاراتی کاتێ کە هاتمە ئێرە ڕەنگی سپی بوو. ئێستاش فەرموو سەیری کە..."
بەڕێومبەرەکە گوتی:"تۆ چیت لێ کردووە؟"
پیاوە گەنجەکە بەتوڕەیی گوتی:"من؟ من هیچم لێ نەکردووە"
پیاوەکە بەڕێومبەرەکەی بە ڕاکێشان بردە لای جل شۆرەکە و گوتی:"ئەم ئامێرە هی تۆیە، وانیە؟"
بەڕێومبەرەکە گوتی:"بەڵێ"
پیاوە گەنجەکە دووبارە بەدلەکەی کاراتیی پێنیشاندا و گوتی:"ئەمە نرخەکەی دوو سەد پاوەندە! ئاخۆ دەربارەی ئەوە چی دەکەی؟"
بەڕێومبەرەکە گوتی:" گەورەم تکادەکەم دێیتە نوسینگەکەم ، ؟ دەتوانین لەوێدا قسەی لێ بکەین"
مستەر بین لە بەرامبەر وشک کەرەوەیەکی گەورە دانیشت.
شۆرتەکانی و جلەکانی تری لەناو ئامێرەکە بوو. ئێستا خاوێن بوونەتەوە و نزیکە وشک ببنەوە.
مستەر بین چاوەڕوانی کرد.
دوای خولەکێك، وشك کەرەوەکە وەستا. مستەر بین هەڵسایەوە و دەرگاکەی کردەوە. پاشان دەستی کرد بە دەرهێنانی جلەکانی خۆی.
دوای یەك دوو خولەك ، ئافرەتە گەنجەکە هاتە لای وشك کەرەوەکەی تەنیشتەوە و ئەویش دەستی کرد بە دەرهێنانی جلەکانی خۆی. جلەکانی ئەویش وشك ببوونەوە.
مستەر بین بیری کردەوە:"لەوانەیە پانتۆڵەکەی منیش لە ناو ئەوانەدا بێت!"
ئافرەتە گەنجەکە هەندێ جلی لە ئامێرەکە دەرهێنا و لەناو جانتایەکی دانا. پاشان ڕۆیشتەوە لای جل شۆرە گەورەکە، بۆئەوەی جلەکانی تر بێنێ.
مستەر بین بەخێرایی جولاَ و لە ناو جلەکانی ئافرەتەکە دەستی کرد بە گەڕان بە دوای پانتۆڵەکەی خۆی. بەلاَم نەیدۆزییەوە.
مستەر بین بیری کردەوە:"پانتۆڵەکەم لەکوێ یە؟ لە شوێنێکە لێرە. ڕاوەستە! لەوانەیە ئافرەتەکە لە ناو وشك کەرەوەکە جێی هێشتبێ"
کەواتە مستەر بین سەیری ناو ئامێرەکەی کرد. یەکەمجار سەری خۆی کردە ناو ئامێرەکە.